# چۆن خێزانەکەت بەڕێوە دەبەیت

وەرگێڕی
سیف الدّین محمّد احمد

# چۆن خێزانەکەت پەروەردە دەکەیت ؟

## أسـرتك أيها المسلم

ـ سيف الدين احمد محمد ـ

---

مطبعة اسعد ـ بغداد

# ـ پێشکەشە ـ

× بەگیانی پاکی پێغەمبەرمان (محمد) ـ صلی الله علیه وسلم سەرداری هەموو پێغەمبەران ·

× بەگیانی پاکی هاوەڵانی محمد ـ صلی الله علیه وسلم و ئەوانەی خوێنی گەشی خۆیان ڕژاند لەسەر شەقامە ڕێگاکەی ئیسلام ·

× بەدایك و باوکم و بەو دایك و باوکانەی کە ·· ساواکانیان پەروەردە دەکەن ، بەپەروەردەیەکی ئیسلامی ·

× بەوخێزانە خووڕەوشت بەرزانەی بوونەتە نموونە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی ·

# - پێشەکی -

سوپاس‌و ستایشی بێ‌پایان بۆخـوای گەورەو پەروەردگاری پـەروەردەکـــەران ، درووود وسلاوی مەتاھەتایی بۆگیانی پاکی پێغەمبەرمان محمد - صلی الله علیه وسلم -وەیارە دلسۆزەکانی‌و ئەوانەی گیانی خـۆیان‌و مالیان بەخشی تامندالەکانیان‌و گەلەکەیـان پەروەردە کرد بەو شێوەیەی خواویستی‌و ئەیەوێ . پەروەردە کـردنی خێزان لـەئاینی پیرۆزی ئیسلامـدا یەکەم خشتی بناغەی کۆمەلی موسـلمانانەو کەمتـــر نی‌یە لەھیچ‌لایەنێ لەلایەنەکانی تری ئەم ئاینە .

لەخێزانی چاك وژیرو پرھۆش‌و خاوێن نـەوەی دلسۆزو ڕەسەن ئەکەوێتەوە ، وەبەپێچەوانەوە خێزانی ڕووخاوو لەخوا یاخی بوو ئەکەوێتەوە . بۆیە کـــاك «سیف الدین احمد» بەپێویستی زانی‌و ھەستا بەوەر گێرانی «اسرتك أيها المســـلم» ی‌دکتـــور [محسن عبدالحمید] و دەست نیشانی ئەو خالانـــەی کردوە کەپێویستە پێش چاوی ھەموو موسلمانێك بخرێت چ

پیاوو چ ژن بۆئەوەی بتوانن بەئاسانی کۆرپەکانیان پەروەردە بکەن لەسەر شەقامە ڕێگاکەی خواو دوور خستنەوەیان لەهەموو توولە ڕێگایەکی چەوتو لار .

ئەم نامیلکەیە ش ئەم چەند خاڵەی خوارەوەی بەڕوونی تێدا دەرئەکەوێت :

**١ - داچوونی کۆمەلانی خەڵك ومرۆڤایەتی بەڕێگای لارو چەوتی مادە پەرستیو شوێن کەوتنی خوو ڕەوشتی تێکدەرو لارو چەوتی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو بێئاگایی کردنی نەوەی مووسڵمانان لەشەقامە ڕێگاکەی خوای گەورەو ....هتد .**

**٢ - چاندنی تۆوی نەزانیو پەروەردە کردنی باوکانو دایکانی ئەم چینە بەویستی داگیرکەرانو بێبڕوایان تائەوانیش هەمان تۆو بنێژن وئەو ڕێگە بگرنەبەر لەپەروەردە کردنی مندالەکانیاندا ، دەرمانی ئەم دەردەش هۆش کردنەوەی کۆمەلە لەدۆستو دوژمنی** خۆییو ئاوورِ دانەوەی بۆلای ڕاستە شەقامەکەی خواو

نەخشە رەنگینە ـ کانی خۆشەویستمان (محمد) صلی الله علیه وسلم ـ چونکە بەسە بۆبەرزیو پاکی (ولکم في رسول الله اسوة حسنة) ٠

٣ ـ وازهێنان لەو ڕێگا هەڵانەی گیراونەتە بەر بۆ پەروەردە کردنی خێزانو بەکارهێنانی ڕێگای ڕاستو دروست لەم ڕێگایەداو بەکارهێنانی وشەی جوانو شیرینو بەسوود نەك لێدانو ووتەی ناشیرین بەرامبەریان ، وەئاگاداربوونی دایكو باوك لەهەڵسانو دانیشتنو ڕەفتاری منداڵەکانیان لەهەموو ڕوویەکەوە ٠

٤ ـ نەهێشتنی دووبەرەکیو ناکۆکی لەنێوان باوكو دایكدا کەزۆرکارئەکاتە سەر گەشەکردنی منداڵەکانیانو گۆڕینی خووڕەوشتیان ، ئەویش بەهەڵبژاردنی کوڕی چاكو خاوەن بۆ کچی خاوەن شەرمو خواپەرست ٠ زۆرنەکردن لەهیچلایەك لەشوکردنو ژنهێنانا بۆئەوەی هیچ هۆیەك یارمەتی دەربێت بۆ ئەم کارە ٠

٥ ـ هەلبژاردنی هاوەلێ چاکی خواپەرست بۆ منداڵەکان لەلایەن باوکو دایکو سەرپەرشتی کەرانیانەوە ، چ لەقوتابخانە ، وەیا بازارو سەر شەقامەکان ، وەیا لەکاتی دەرچونی لە ماڵەوە ٠

٦ ـ دەست گرتنی منداڵ هەر لەسەرەتای ژیانی یەوەو راکێشانی بۆ باخچەی ژیان لەگەل حواو پێغەمبەردا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وجێگیر کردنی خۆشەویستی ئەوانو هەموو موسڵمانە راستەکان لەدلیدا ٠

٧ ـ وەلام دانەوەو بەپیرەوە چوونی منداڵو لاوەکان بەدلێکی فراوانو ڕوویەکی خۆشو زانیاری یەکی بتەوو راستەوە بۆ ئەو پرسیارو داوایانەی کەوا هەیانە ٠ وەفەراهەم هێنانی هەموو جۆرە پێویستی یەکی ژیانی موسڵمانانەو گونجاو لەگەل خواستەکانی ئادەمیزادا بەبێ دەرچوون لەو سنورەی کەخوا رەنگی ڕێژاوە ٠

طاهر احمد عبدالقادر

## ـ بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە ـ

ـ ١ ـ

گرنگترین ئەرکێك کەڕوو بکاتە مرۆڤی موسڵمانی ئاگادارو پڕهۆش بەرامبەر بەئاینەکەی بریتی‌یە لەهەست کردن بەلێپرسینەوە دەربارەی پەروەردە کردنی خێزانەکەی بەپەروەردەیەکی ئیسلامی‌و جێگیر کردنی ئەو بیروباوەڕە لەقوڵایی دڵیاندا ، پەروەردەیەکی ئەوتۆ کەدووربێت لەهەموو تەم‌و مژێکو لاربوو ـ نەوەیەکی باوەڕو هەموو نەخۆشی‌یەکانی کۆمەڵ(١) خێزانی موسڵمانی ئەمڕۆ بەرەنگاری دوو ڕێبازی ڕووخێنەو ئەبێت ، ڕێبازی کۆنی نەفامی‌و نەخۆشی کەئەویش ئەگەڕێتەوە بۆدیرین ترین چەرخی بێباوەڕی دوواکەوتوو ، وەهەروەها دواکەوتن لەڕووی

---

(١) بێگومانم لەوەی کەهەر خێزانیك بەپەروەردەی ئیسلامی پەروەردە ببێت میکرۆبی هیچ نەخۆشی‌یەکی کۆمەڵایەتی ناتوانێ سەرکەوێت بەسەریدا ٠

شارستانیه‌تی‌یه‌وه ، وه‌نوقم‌بوون له‌گێژاوی هه‌مـــــوو
خووڕه‌وشتێکی نه‌زانیدا ٠

وه‌ڕێبازێکی تری پڕله‌دڵه ڕاوکـــه ، که‌ئه‌ویشـــ
بانگی مرۆڤه‌کان ئه‌کـات بۆبه‌ندایـــه‌تی ماده‌و دوور
خستنه‌وه‌یان له‌دۆزینه‌وه‌ی ڕێگه‌ی خواییو هێنـــــانو
سه‌پاندنی‌هه‌ندێك بیروباوه‌ڕو خووڕه‌وشتی کۆمه‌ڵایه‌تی
که‌به‌هیچ جۆرێك له‌گه‌ڵ بوون ( فطـرة )ی مرۆڤــــدا
ناگونجێت ٠ وه‌له‌مه‌وه تێ‌ئه‌گه‌ین هه‌ردوو ڕێبازه‌کـــه
یه‌ك سه‌رچاوه‌یان هه‌یه‌و هه‌ر یه‌که‌یان خزمه‌تی ئـه‌وی
تریان ئه‌کات واته ڕێبازی یه‌که‌م مرۆڤی داوه‌ته ده‌ست
ڕێبازی دووه‌م ٠

به‌ڵام ڕێگای دووه‌م زیاتر له‌ناو خه‌ڵکیدا پیشه‌ی
داکوتا به‌تایبه‌تی له‌وولاتی ئیسلامیدا به‌نیازی سڕینه‌وه‌ی
باوه‌ڕ به‌خوا له‌دڵی مووسڵمانانداو ـ لابردنی هه‌مـوو
خووڕه‌وشتێکی جوان که‌له‌وه‌وه سه‌رچاوه وه‌رده‌گرێت ٠

وه‌گه‌ر بێتو ئێمه‌ی مووسڵمان سه‌یری نیشـــــه
کانی دووژمنانی ئیسلام بکه‌ین بۆمان ده‌ر ئه‌که‌وێـت
که‌چه‌نده‌ها پیلانیان گێڕاوه بۆپارچه پارچـه کردنـــی

دەوڵەتی ئیسلامیو ڕوواندنی تۆوی گومانو بێباوەڕی لەنێوان دلی مووسلمانەکانداو بەکارهێنانی هەموو هۆیەکی بێباوەڕی لەتێکدانی شیرازەی خێزاندا چونکە خێزان بناغەی کۆمەلی ئیسلامییە ( المجتمع الاسلامي) .

وەهەولێکی ئێجگار زۆریان دا لەبەنج کردنی بیروباوەڕی مووسلمانەکان وەداهێنانو بلاوکردنەوەی گەلێك بیروباوەڕی پووچەلو ڕووخێنەر . ئەمە لەلایەکو لەلایەکی ترەوە دەستیان کرد بەخەریككردنی موسلمانەکان بەگەلێك هۆی دواکەوتنو لەناوچوونەوە بەناوی پێشکەوتن وشارستانییەوە .

بەڵێ : ئەبێ ئەوە چاك بزانین پیشکەوتنو دواکەوتنمانو خۆشیو ناخۆشیمان بەستراوە بەڕادەی دەستگرتنمانو ژیانمان لەژێر سێبەری قورئاندا ، چ کاتێك ڕێگای خوامان گرتو ئەومان کرد بەمەبەستی ژیانمانو خۆمان دامالی لەهەموو بەندایەتییەك بۆبەندایەتی ئەوو هەمیشە چاوەڕوانی فەرمانەکانی ئەومان ئەکرد بۆ جێبەجێکردنو چارە سەرکردنی هەموو

نیش‌و کاریك‌و گیرو گرفتیکمان ، بەمە ئێمە ئەبین بەکۆمەڵێك بەستراوین بەبەهێز ترین‌هیزەوە کەئەویش هێزی خوایە ئەوکاتە تێ‌ئەگەین لەمانای ژیان‌و ئیتر هیچ گەسێك ناتوانی مەبەستی خۆی بەئێمە بهێنێتە دی ٠

بەلام بەپێچەوانەی ئەوەی سەرەوە ئەبێ بەداری دەستی دوژمنانی خواو هەربە خۆمان ئەداتەوە لەخۆمان‌و چی‌بوێت پێمان ئەکات ٠

ئەگەر لەمە تێکەیشتین ئەو کاتە تەنها ئەوە بەس‌نی‌یە بلێین بەلاوەکانمان نوێژ بکەن ٠٠ قورئان بخوێنن ٠٠ لەخوابترسن ٠٠ هتد

بەلکو پیویستە هەموو سەرپەررشتی‌کەرێك کەلێپرسراوی خێزانێکە بەپێی پرۆگرامێك لەسەر نیشەکەی بڕوات لەپەروەردە کردنی منداڵەکاندا چ کوڕ وەچ کچ وەهەول بدرێت وەها پەروەردە بکرێن کەبەرگری پەیدا بکەن بەرامبەر میکرۆبی هەموو جۆرە نەخۆشی‌یەکی بیرو باوەر ٠ وەئەو گیرو گرفتانەیش کەدروست ئەبن لەنێوان خێزاندا ئەبێ

بەشێوەی لێزانانە هەوڵ بدرێت بۆڕیشە کێش کردنیان پێش ئەوەی پەرەبسێنێت‌و ببێت بەکۆسپ لەڕێگـای مەبەستە سەرەکی‌یەکەی بەڕێوەبەری خێزاندا ٠

لەمەوە ئەگەینە خاڵێکی گرنگ ئەویش ئەوەیـــە پێش هەموو شتێك ئەبێ ئەوگیرو گرفتەی کەدێتـــە ڕێگامان لەناو خێزاندا دیاری بکەین‌و هۆیەکـــانی‌و ئەنجامەکانی بزانین ئەوسا هەوڵ بدەین بۆنەهێشتن‌و چارەسەر کردنیـــان ٠

یەکەم گیروگرفتی خێزان بەلای زۆربەی راناکانی ئیسلامەوە ئەوەیە ژن‌و پیاو وەبەتایبەتی پیـــاو شارەزایی‌یەکی ئەوتۆیان لەئیسلامدا نی‌یە کەبتوانـن بەشێوەیەکی موسڵمانانە منداڵەکانیان پەروەردە بکەن وەخاڵێکی گرنگی‌تر هەیە ئەویش ئەوەیە پێویستــە پێش ئەوەی کوڕ ژن بهێنێت وەکچ شوو بکات خەمی ٠٠ پەروەردەی خێزانەکەی بخوات ٠

ئەویش لەو ڕێگایەوە هەریەکەیان هـــاوسەری موسڵمان بۆخۆی دیاری بکات چونکە ئەگەر هـــات‌و ئەو ژن‌و پیاوە هەردووکیان موسڵمان بوون ئەتوانــن

خێزانێکی نمونەیی (خێزانیکی موسلمان) دروست بکەن و هیچ کات ماندوو نەبن .

بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت یەکێکیان مووسلمان بێت و ئەوی تریان باش نەبێت ئەو کاتە داڕشتنی ئەو خێزانەی کەئەمانە وێت زۆر گرانەو هەوڵێکی زیاتری ئەوێت .

جابۆ ئەم مەبەستە پێویستمان بەسەرنج داتێکی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵــە خۆشەویستەکانی هەیە ، لەم ڕووەو هەموو ڕوویەکی تری ژیانەوەچۆنوەستاون بۆئەوەی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر «صلى الله عليه وسلم» ڕێگایان بۆ دابنێت . وەپێویستە لەسەر مووسلمــان ئاگــای لەدەرەوەی خێزانەکەیشی بێت بۆئەوەی هەموو ئەو شتانە بناسیت کەئەبنە هۆی لاوازکردن و هەڵوەشانەوەی خێزان .

وەئاگادار بێت لەو پیلانانەی کەدوژمنانی ئیسلام دایان نــاوە بۆتێك دانی کۆمەڵگای موسلمانەکــان لەهەموو ڕوویەکی ژیانەوە واتــە خێزان بپارێزرێت

ئەهەموو خووڕەوشتیکی نەزانی (جاهلی) هەڵســــانی ، دانیشتنی ، بیرکردنەوەی ، شێوەی ، بیروباوەڕی ..

وەهیچ سودێـــك بەخێزان ناگـــات کاتێك پەروەردەکەر ، تەنها بەوە واز بهێنیت کە خــــۆی بەمووسڵمان بزانێت ، وەهیچ سودێکیان پێناگەیەنێت بازۆر سوریش بێ لەجێبەجێکـردنی فەرزەکانیـــدا بێئەوەی هیچ کارێك بکاتە سەر ئەندامەکانی ، چونکە بەشێوەی بیروباوەڕ ئایینی وەرنەگرتووەو شێوەیەکی رۆنینی گرتووە ، بەڵکو ئەبێ خۆی ببێت بەمامۆستـــا بۆئەوانو خۆی دەست پێش خەری بکات لەهەمـــوو کارێکی چاکدا وەئەبێ پەروەردە کردنەکـەی پێشـــی هەموو شتێك لەسەر بناغـــەی باوەڕ بەخـــوابێتو بەتەواوی لەگەڵ ئیسلامدا بیان ژیەنێت ، وەپەرتووکی ئیسلامییان بۆ بخوێنێتەوە ، ئینجا هەرشتێکی تــازە ڕوویدا بۆیان باس بکات بەشێوەیەکی ئیسلامی ڕوونی بکاتەوە لایەنە خراپەکانیان بۆدیاری بکاتو ئاگاداریان بکات بۆئەوەی خۆیانی لێلادەن وەلایەنە باشەکانیشی

دەست نیشان بکات‌و فەرمانی کەلـك وەرگرتنیـــان پێ بکەیەنێت ٠

لەبەر ئەوە ڕۆلەکانی ئیسلام پێویستی‌یەکی تەواویان هەیە بەتێگەیشتن لەئاینەکەیان‌و بەشێوەیەکی تەواو بی‌بەستن بەهەموو ئیش‌و کارێکی ڕۆژانەیانەوە ئەوکانە بەتەواوەتی شیرینی ئیسلام ئەچەژن ٠٠ واتە ئەبێ ئەوسنورە تەسکە کە دوژمنەکانی ئیسلام بۆیان کێشاوە ئەبێ بشکێت‌و هـەر تەنها چـــوار چیوەی مزگەوت نەبێت بەشوێنی ناسینی پەروەردگار وەبـــۆ ئەوەنەکراوون کەئەبێ مرۆڤ‌هەرلەوێدا خوا بپەرستێت بەلکو ئەبێ دەست‌دانە هەر کارێك ، لەماڵ چوونـــە دمرەوە،لەقوتابخانە ، لەکارگە ، لەدانشگار ـزانکۆ ـ لەکێلگە ، لە بازاڕدا ، لەفەرمانگا ، ٠٠٠٠هەتد بەپێی ویستی خوای گەورە بێت ، ئەو کاتە تێ ئەگەین ئیسلام چی‌یەو ؟ پەیوەندی بەژیانی ئێمەوە چی‌یە ؟ !

گیرو گرفتی دووەم : زۆر لەوانەی کەپەروەردەی خێزان ئەکەن لەسەر شێوەیەکی ڕێك‌و پێك پـــــی هەڵناسن وەنایکەن بەئیشێك بۆ خۆیان بکرە وانەزانن

کەمرۆڤ خێزانی هەبوو ئەبێ ئەندامەکانـــی هـــەر ئەخۆیەوە باش پەروەردە بێ بەبێ ئەوەی ئەم هیچ خۆی ماندوو بکات •

هەندێك بـــاوكو دایك هەیــە کاتێك ئەیانــەوێ منداڵەکانیان فێری شتێکی چاك بکــەن وەیاخـــــود لە خوورەو شتێکی ناشیرین دوریان بخەنەوە ناوچاویان درژ ئەکەنو زۆر بەدڵ ڕەقی یەوە ڕەفتاریان لەگەڵـــدا ئەکەن،وەنازانن ئەوکەسەی ئەمان ئەیانەوێت پەروەردەی بکەن نەخۆشەو لەناو کۆمەڵێکی دەردەداردا ئەژی لەبەر ئەوە پەروەردەکەر ئەبێ خۆی بەپزیشك بزانێت بـــۆ چارەسەر کردنـــی نەخۆشی یەکانیان ، یگرە زۆرجار ئەبینین پزیشکێك ئەیەوێت چارەســـەری نەخۆشێك بکاتو ئازارەکەی لەکۆل بکاتەوە کەچی نەخۆشەکـــە گەلێك قسەی ناشیرین بەرامبەری ئەکات،ئەویشـــ بێ ئەوەی تەنانەت یەك تۆز ناوچاوی درژ بکات بەڵکو هەربەدەمیەوە پێ ئەکەنێت چونکە ئەم زانایەو هەست بەوە ئەکات کەپێویستە زوو هەوڵ بدات چارە سەری دەردەکەی بۆبکات •

بەڵێ : مرۆڤی موسڵمان پزیشکەو ئەوکەسەی قسەی بۆئەکات نەخۆشەو ئەبێ لێهاتوانە هەست بەلێپرسینەوەبکات وەبەپێی پێویست لەدەرماتحانەکەی ئیسلامدا دەرمانی بداتێ ۰

هەندێکی تر هەن تائێستاش باوەڕیان وایە کەوا ڕێگا بەمنداڵەکانیان نەدەن نزیکی هیچ جۆرە گۆڤار «مجلة»یەکی بەدخویی ببنەوەو ئەگەر لەماڵەکانیشیاندا هەبێت بیدڕێنن‌و بەشێوەیەکی ناشیرین بقیرێنن بەسەر منداڵەکانیانداو ۰۰ لێیان بدەن ئایا ئەمە چارەیە بۆئەم کارە ؟؟

بێگومان نەخێر ۰۰ وەیاخود ئەیانەوێت منالەکانیان نەماڵەوە بەند بکەن‌و نەیەنە دەرەوە بۆئەوەی ڕێگای چوون بۆسینەمایان لێقەدەغە بکەن ، تائەو فلیمانە نەبینن کەپەروەردەکەر بەچاکیان نازانێ ۰۰

هەندێ باوك وائەزانێ پەروەردەی ئیسلامی بریتی‌یە لەوەی کەمنداڵەکەی چەند ئایەتێك وەیان چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ نەبەر بکات ، یابەزۆر پەرتوکێکی ئاینی بدات بەسەریدا

تا بیخوێنێتەوە باوەکو ئەو منداڵە حەزی لێ نەکـــاتو توانای خوێندنەوەی نەبێتو نەتوانێ وەری بگرێت ..

بێگومان ئەم جۆرە کارانە هەتا بێ لەئیسلامر دوریان ئەخاتەوە وایان لێ ئەکات هەمیشە لەباس کردنی ئیسلام بترسن ، هیچ کاتێك نایانەوێت لەئیسلام تێبگـــەن.

یاهەرکاتێك باوکیان دیار بێت بەپێی دڵـــی ئـــەو ئەجولێنەوە بەڵام لەنهێنیدا هەرچییەك پێچەوانــــەی فەرمانی ئەو بێت ئەیکەن .

چاپێویستە لەسەر هەموو باوکێکی دڵســــۆزو پەروەردە کەرێکی پڕ هۆش بەشێوەیەکـــی جـــوان لەگەڵیاندا هەڵسێو دانیشێ ، خۆشەویستی بکـــات بەبناغەی دەست پێکردنی ئیشەکەی .

لەهەموو گۆشەیەکی ژیانی منداڵەکانـــی ئاگادار بێت بۆئەوەی بەئاسانی بتوانێ بزانێ چییان پێویستە وەئەبێ بەر چاویان ڕۆشن بکاتەوە دەربارەی ئەو توولە ڕێگایانە لەناو کۆمەڵگای موسڵمانەکاندا بڵاو بوونەتەوە، بەمانایەکی ترکاتێك موسڵمان منداڵەکانی بەپەروەردەی ئیسلام گوش ئەکـــاتو لـــەدۆخێك ـ ی خوایــــیدا

بیژێنێت ئەو کاتە هەرچ شتێك جگە لەبەرنامەکـەی پەروەردگار بێتە ڕێگای یەکسەر هەستی پێ ئەکـاتو ئەزانێ پێچەوانەی ئەو شتەیە بەم لەسەریەتـــی ٠٠

پێویستە دایكو باوك (پەروەردەکـــەر) خۆیان خۆشەویست بکەن لەلای منداڵەکانیان هەر لەو کاتەوە کەلەکۆشی دایکیاندان ولەکاتی شیر خواردندان ٠

زاناکانی دەروون ـ علماء النفس ـ دەریان خستوو کەمنداڵ لەسەرەتای ژیانی‌یەوە زۆر چـــاك شت وەر ئەگرێتو هەوڵ ئـەدات شوێنی خۆشەویستەکـــەی بکەوێت ، هەرچی‌یەك ئەو بیکات ئەمیش هەڵئەسـێ بەکردنی‌و لەپاشیشدا هەر بەو ڕێگایەدا ئـــەڕواتو ئەیکات بەکالای بالای خۆی ٠ جائەگەر هاتو ئـــەو خۆشەویستە باوکی بوو ئەوا زۆر بەچاکی بەشوێنیـــا ئەڕواتو هەموو شتێکی لێوە وەرئەگرێت ، هەرچی‌یەك لەباوکی‌یەوە دەرچێت زۆر بەچالاکی پێی هەڵئەسێت وەدژ بەهەموو شتێك ئەبێت کەپێچەوانەی ویســـتی باوکی بێت ٠٠ ئەگەر هاتو ئەو باوکە موسڵمان بێتو ئەیویست منداڵەکانـی بەپـەروەردەیەکی ئیسلامـــی

پەروەردە بکات ئەوا زۆر بەچاکی سەرکەوتوو ئەبێت لەکاتێکا هەرلە سەرە تاوە خۆشەویستی خۆی لەدڵی منالەکانیدا ئەچێنێت • کاتیك خۆشەویستی باوکیان لەدلیاندا جێ گیر بوو ئەوا خۆشەویستی ئیسلامیشــ لەدلیاندا جێی خۆی ئەکاتەوە •

لەپاشان رۆژ لەدوای رۆژ کاتێك لەگەل باوکیدا ئەژی شەخصیەتی دەر ئەکەوێتو خوورەوشتی جوانتر ئەبێت ئالێرەدا ئەو پەروەردەکەرە بەرهەمی ئیشەکەی وەرئەگرێت •

ئەگەر بێتو موسلمان خۆی نەکات بەنموونــــە بۆمندالەکانی ئەوا نموونەیەکیتر وەرئەگرن ئیتــــــر لەقوتابخانە بێت ، یالە سەر شەقامو کۆلانەکانـــــدا بێت وەیان لەناو پەراوو گۆڤارە (مجلة) کاندا بیت •

جالەوانەیە ئەوشتانەی چاوی لێئەکات خــراپ بنو هەر لەسەرەتای مندالیەوە خوورەوشتی تێــــك بدەنو ژیانی بەبەد خوویی بەرێتە سەر گەلێك خراپــە تێکەل بە خوورەوشتی ببێت ئەوکاتە هەرچی ئـــەو

قسانەی کەبۆی کراوە یان‌بۆی ئەکرێت سوودی نابێ‌و پووچەڵ ئەبێتەوە ·

بۆ ئـــەم مەبەستە پێویستە پەروەردەکـــەر نێکەڵاوی‌یەکی زۆرو پـــڕ لەخۆشەویستی لـــەگـــەڵ خێزانەکەیدا هەبێت ، پیۆیستە لەگەلیاندا دابنیشیت‌و ووتوو وێژی بەسوودیان لەگەڵـدا بکـات ، هەمیشـــە مژدەی خۆشیان بداتێ‌و دڵی فراونی بکاتەوە بۆیـــان‌و بەهێمنی‌یەوە لەگەڵیاندا بدوێت ·

بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك بۆیان دەربخـــــات کەئەیەوێت لەپێناوی ئەواندا بژی‌و ئەرکی‌سەرشانـــی ئەوەیە ژیانێکی بەختەوەرو پڕلەکامەرانیان بـــۆبەدی بهێنێت ·

بەڵام بەداخەوە تائێستەیش زۆر کەس هەیـــــە لەپەروەردە کردنی خێزانەکەیدا بیروڕای کۆنی پێش ئیسلام بەکار ئەهێنێت گـوایە ئەڵین : پێویستـــە باوك بەدەم منداڵەکانیەوە پێ‌نەکەنێت‌و هاوڕێ‌یی‌یـان لەگەڵدا نەکات‌و قسەی خۆشیان بۆنەکات بۆئـەوەی لەبێش چاویان سووك نەبێت‌و سامی هەبیت لەلایان !!

ئەم جۆرە بیروباوەڕانە بەلای ئیسلامەوە ئێجگار هەڵەن‌و بەهیچ جۆرێك پەسەند ناکرێن چونکە نەك هەرهۆنین بۆپەروەردە کردن بەڵکو دووژمنایەتی لەنێوان بەڕێوەبەری خێزان‌و ئەندامەکانیدا پەیدا ئەکات

ئەگەر سەیرێکی ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم بکەین لەخێزانەکەیدا ئەبینین هەمیشە بەخۆش بەختی‌و کامەرانی ژیاوە ٠
خێزانەکانی ئەگیرنەوە هەرکاتێك بهاتایەتەوە بۆ ماڵەوە بەزەردە خەنەو دەمی پێکەنینەوە خۆی‌ئەکرد بەژووردا ، لەبەر ئەوە دەبینین ڕەوشتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەپەروەردە کردندا چاکترین نموونە بوو بۆ هاوەڵەکانی ـ خوایان‌لێ ڕازی بێت هەمیشە لەم رووەوەو هەموو ڕوویەکی ترەوە هەرچاویان لەو کردوە ٠

باسەرێك لەماڵی خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم عومەری کوڕی خەططاب بدەین ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ تابزانین چۆن لەناو خێزانەکەیدا ژیانی بردوەتە سەر ـ:

ڕۆژێکیان ـ عمـــر ـ لەماڵەوە لێی پاڵ کەوتبوو هەموو مناڵەکانی‌و کـوڕەزاو کچەزاکانـــی لێی کۆبووبوونەوەو چووبوونە سەر پشتی یـاری‌یان بەسەرو ڕیشی ئەکرد ، ئاڵەم کاتەدا یەکێك لەکـــار بەدەستەکانی کەفەرمان ڕەوای یەکێـك لەشـــارە ئیسلامی یەکان بوو هات‌و ئەم دیمەنەی بە ـ عمرـەوە بینی زۆر سەرسام بوو بەشتێکی ناشیرینی ئەدایـــە قەڵەم ٠ وادەر ئەکەوێ کەناڕەزایی خـۆی دەربڕی بێت

ئەم کارە ، بۆیە ـ عمر ـ خێرا پرسیاری لێ ئەکـات‌و ئەلێ : بۆچیێ تۆ لەناو خێزانەکەتدا بــــەچ شێوەیــەك ڕەفتار ئەکەیت ؟! کابرا وتی منداڵەکانم ئەوەندە لێم ئەترسن هەر کاتێ کەئەچمەوە ماڵەوە هەریەکـــەیان لەسوچێکـــەوە دائەنیشن‌و ناوێرن بەهیـــچ جۆرێك بجووڵێنەوە٠٠؟لەبەر ئەوە عمر سەری ڕاوەشاندو وتی لەکاتێکا تۆ خۆشەویستی‌و بەزەیبیت لەگەڵ منداڵەکانی خۆتا نەبێت ئیتر چۆن ئەتوانـــی دڵسۆزو میهرەبان‌و بەبەزەیی بیت لەگەڵ موسڵمانەکاندا؟وەئەوەیش بزانە هەموو ئەمانەی کەتۆ ئەیلێیێ پێچەوانـەی پەروەردەی

ئیسلامی‌یە لەبەرئەوە والەم‌کاتەوە لەفەرمـــانڕەواییم
خستیت . چونکە تێکەڵاوی بەڕێوەبەری خێزان لەگەڵ
ئەندامەکانیداو شیرینی گوفتارو کرداری پێشەکی‌یەکی
نیچگار کرنگە بۆگەیشتن بەو ئامانجەی خۆی ئەیەوێت
کەبریتی‌یە لەناشتنی تۆوی باوەڕ بەخـــوا لەدلـــی
منالەکانیداو گۆش کردنیان بەشیری ئیسلام . جائەگەر
باوك خۆی نەکات بەهاوڕێی منالەکانی ئەوا ئەگەڕێــن
لەدەرەوەی خێزاندا هاوەڵ بۆخۆیان پەیدا بکەن وەهیچ
دوور نی‌یە ئەو هاوەڵانە خراپ‌بن وئەمانیش بەدخـــوو
بکەن بەڵام ئەگەر ئەو مندالانە لەگەڵ باوکیاندا بەجوانی
ژیان‌و هەست‌و سۆزیان لەباوکیانەوە بەدی ئەکـــــرد
هەمیشە هەوڵ ئەدەن هاوەڵی یەکێك بکەن لەخـــوو
ڕەوشتداوەك باوکیان وابێ . بەم چەشنە باوك نەخشەی
ڕێگای ڕاست بۆ مندالەکانی ئەکێشێت‌و لەبەردەمیـــانا
دای ئەنێت بۆئەوەی وێنەیەکی زیندووی ئیســـــلام‌و
خووڕەوشتە جوانەکانی لەناخی دڵ‌و دەرونیاندا ڕیشە
داکوتێت .

لە کاتێکا باوك لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکەیدا

ئەزیو منداڵەکان هەست بەسۆزو خۆشەویستی باوکیان ئەکەن هەمیشە پێخۆشحاڵن هەرگیرو گرفتو ناتەواوی یەکیان هەبێت بۆ باوکیانی باس بکەن تاوەکو بۆیان چارەسەربکات وەهیچ کاتێك شت لەباوکیان ناشارنەوەو جگە لەو گیروگرفتەکانیان بۆ هیچ کەسێکی خراپ باس ناکەنو هاورای بۆنابەن تابۆیان چارەسەر بکات ٠

بەڕێوەبەری خێزانی موسڵمان بەلێهاتوویی خۆی هەوڵ ئەدات ئەو تاریکیو ناخۆشی یانەی کەرووبان تێ ئەکات بەڕووناکی ئیسلام چارەسەریان ئەکات ، نایەلێت لەناو ماڵەکەیدا ریشە داکوتێ ، هەرچ لارییەك لەخووڕەوشتو هەڵسو کەوتیانا هەبێت بەپێی پرۆگرامی خوایی ڕاستی ئەکاتەوە بەم شێوەیە ئەیان خاتە سەر ڕێگاکەی ئیسلامو نایەلێت هیچ گەردێك ڕویان تێ بکات ٠

زۆر الهزانا مووسڵمانەکان ئەلێن : گەورەترین گیروگرفت کەڕوو بکاتە خێزان ئەوەیە کەباوك تێکەلاوی لەگەڵ ئەندامەکانیدا نەکات٠جائەمە وای لێدێ هەندێك

لەمنداڵەکان خۆیان بەبێگانە بزانن لەوماڵـــەدا ئەمەیش ئەبێە هۆی ئەوەی دڵیان بۆ باوکیان نەکەنەوەو گەلێك نهێنی خۆیان ئەشارنەوە نایەڵن پێیان بزانێ وەئـەم شاردنەوەیش ئەبێتە هۆی ئەوەی سەرۆکـــــی خێزان بەتەواوەتی ئاگای نەبێت لێیانو هەریەکە بەسەربەستی خۆی بژیتو هیچ کامیان پەیوەنـدی بەوی‌تریانـــەوە نەبێت ، لەئەنجامدا شیرازەکەی تێك ئەچێتو هـــەڵ ئەوەشێتەوە . .

لەم ڕۆژەدائەم گیروگرفتانە تووشی هـــەموو خێزانێك بووە تەنها هەندێکی کەمیان نەبێت، ئەبینین ئەو باوکە هیچ شتێك لەبارەی منداڵەکانیەوە نازانـێ بەڵکو تەنها هەر بەلەش لەو مـــاڵە دایـــە ، کاتێك منداڵەکانی بڵاوە ئەکەنو هەریەکە ئەچێتـــــە ژووری تایبەنی خۆی باوکیش لەژوری خۆیدا نوقم بووەو هیچ ئاگایەکی لێیان نییە ، «ئازاد»ی کوڕی لەگەڵ چیرۆکی پۆلیسیدا ئەژیو «بەختیار» یش لەگەڵ گۆڤـــــار ی تێك دەرو بێ‌ئابڕوییدا ئەژی ، «ڕزگار» لەگـــەڵ

ئەخۆشی دەروونی «نەفسی»و دڵە ڕاوکـــەی خۆیدا ،
«ژیان»یش لەگەڵ گیرو گرفتی قوتانجانەیدا .

ئیتر بێ ئەوەی باوکەکەیش هیچ ئاگایەکی لـەم جۆرە شتانە هەبێت ، ئێرەوە ئیشی ئەم یا بڵێین ئەرکی سەرشانی دەربارەی منداڵەکانی لـەسنوری چـەند ووشەیەکی ڕووت دەر ناچێت ، بۆ نمونە پێیبیان ئەڵـێ ڕۆڵەکانم نوێژی نیوەڕۆ یاعەسر ، یا ئێوارەتان کرد ؟

ئەوانیش خێرا بەووشەیەکی درۆ وەڵامی ئەدەنەوەو دڵنیای ئەکەن بەڵێ بابەگیان هەمود نوێژەکانمان لەکاتی خۆیدا کرد ، باوکیش دڵ بەم چەند ووشەیە خـۆش ئەکات ، بێ ئەوەی هیچ ئاگایەکی لەڕاستی کارەکـە هەبێت بێدەنگ ئەبێتو وائەزانێ هەموو شتێك تەواو بووە ، بەڵام نازانێ ئەوەی ئەو پێی دڵخۆش ئـەبێت پێچەوانەی ویستەکەی دەرئەچێت لەهـەموو شتێك خراپتر ئەوەیە هەروا ئەزانێ هەرچی لەماڵەکەیـدا هەیە بەپێی خواستی ئەو ئەجوولێنەوە .

جابا ئێمە بێینو پرسیارێك بکەین ئایا منداڵـی ئەم جۆرە مرۆڤانە لەکوێنو لەکوێ کاتیان بـەسـەر

ئەبەن‌و لەگەڵ کێدا ئەژین‌و خەریکی چین؟ یەکسەر ئەم وەڵامەمان ئەدرێتەوە : لەسەر شەقامەکان بەشێوەیەکی بەدخوویی لەگەڵ هاورێی نالەبارو لاساردا کات بەسەر ئەبەن ، بوون بە درك لەرێگای خەڵکیداو ئازاریان ئەدەن ، هەمیشە هەر خەریکی ئەوەن تابزانن لەکوێوە ئافرەتێك دەر بکەوێت تاچاوە ژەنکنە کانیان ئەوەندەی تر ژەنگ دار بکەن · یأبەهۆی کەوتنیان لەمەلهاو سینەماو فلیمە کانیەوە ، یاگازینۆو چاخانەکان کۆبوونەوەیان لەسەر مێزی قومار بەنج کراون‌و هیچ ئاگایەکیان لەم جیهانە نی‌یە ، بەڵکو بکرە رۆژێك لەرۆژان دانانیشن بیرێك لەچارەنووس‌و ژیانی خۆیان بکەنەوە ·

بێ‌گومان هەروەکو لەپێشەوە وتمان تاکە هۆیەك بۆ تێك چوونی رێرەوی منداڵ بێ‌ئاگیی پەروەردەکەرە لەبەرنامەکەی ئیسلام‌و شارەزا نەبوونیەتی لەقورئانی پیروزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم چونکە کاتێك مرۆڤ ئیشێك ئەکات لەسەر بناغەی زایناری نەبێت بەهیچ

شێوەیەك سەر كەوتوو نابێتو ناگاتە مەبەستەكەی.
وەك حەسەنی بەسری خوای لێ ڕازی بێ - ئەفەرمـــوێ
العامل على غير علم كالسائر على غير طريق ، والعامـل
على غير ما يريد يفسد أكثر مما يصلح .
واتە : كەسێك ئیشكەر بێتو زانیاری تیـــا
نەبێت وەك ڕێبوارێك وایە لەسەر ڕێگا نەبێت ، وەئەو
كەسەی ئیش كەر بێت لەسەر ئەو مەبەســـتە ئەڕوات
كەخۆی ئەیەوێت لەباتی ئەوەی بەرهەمی ئیشەكـــەی
چاك بێت بەخراپ دەر ئەچێت ..
ئێمە كاتێك ئەڵێین ئەمانەوێت خیزانـەكەمـــان
بەپەروەردەیەكی ئیسلامی پەروەردەبكەین مەبەســتمان
ئەوەیە بەئارەزووی خۆمان ئەم كارە بـــەجێ ناهێنیـــن
بەڵكو ئەبێ بزانین خوای گەورە چۆنی ئەوێت بەوشێوە
یە بجوڵێینەوە ، واتە ئێمە خاوەنی خۆمان نین چونكـە
بەندەی پەروەردگارین ، ئەو كارو وتانەی كەئەیـان
كەین ئەبێ هەمووی لەو سەرچاوە وەر بگیرێت . لەبەر
ئەوە پێویستمان بەوە هەیە خۆمان شارەزای قورئانو
فەرموودەكانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بكەیـن

تابه‌کوبرانه نه‌نیشینه مل‌و هه‌نکاو له‌تاریکیدا بنۆمین‌و

له‌ئه‌نجامــدا به‌پێچه‌وانه‌ی ئــه‌و ...ینه‌وه بچین

که‌ئه‌مانه‌ویت

که‌واته قورئان ڕوناکی‌یه‌کی به‌هه‌نکاو نایه‌لێت بکه‌وینة

هیچ چالاویکه‌وه‌و له‌هه‌موو کۆسپ‌و هه‌لدێرێك ڕزگارمان

ئه‌کات ، به‌مه‌رجێك ئیمه ده‌ستی خۆمـانی بــده‌ینێ‌و

بیکه‌ین به‌پێشه‌وای خۆمان ...

---

بـاوك وه‌نـه‌بێت ته‌نهـا لێ‌پرسراو بێت

له‌منداله‌کانی به‌لکو پێویسته له‌گه‌ل دایکیاندا بزانێت

چۆن ئه‌ژی په‌یوه‌ندی نێوانیان به‌هێز بکات هه‌ربـه

وشێوه‌یه‌ی که‌خوای گه‌وره ئه‌یه‌وێت ، چونکـــه دایــك

چاکترین یارمه‌تی ده‌ره بۆ پیاو ، ئه‌بێ پێش ئـه‌وه‌ی

بایه‌خ به‌منداله‌کان بدات ئاگای له‌هاوسه‌ره‌که‌ی بێت‌و

به‌چاکی په‌روه‌رده‌ی بکات‌و تێ‌ی بگه‌یه‌نێت ، چونکـــه

منداله‌کان زیاتر هۆگری دایکن وبه‌شێکـــــی زۆر

ئه‌ژیانیان له‌ماله‌وه له‌گه‌ل دایکیاندا به‌سه‌ر ئـــه‌به‌ن

وله‌ژێر چاودێری ئه‌ودان چائه‌گه‌ر دایکیان موسلمان‌و

تێگەیشتوو بێت وەلەگەڵ مێردەکەیدا یەك ڕایان هەبوو ، وەهەمیشە دائەنیشتن لەگیرو گرفتەکانی خێزانەکەیان ئەدوان تاچارە سەریان بکەن ئەوا دامەزراوی وبەختیاری ڕوویان تێ ئەکات • بەلام ئەگەر بەپێچوانەوە بێت واتە : پیاوەکە ڕایەکی هەبێتو ژنەکە ڕایەکی تری هەبێت پەیوەندیەکی بەهێز لەبەینیاندا نەبێت ، کاتێك باوکەکە شتێك بەمنداڵەکانی ئەلێتو ئەیەوێت لەگۆشەیەك لەگۆشەکانی ژیان ئاگاداریان بکات ژنەکەی هەمووی بۆهەڵئەوەشێنێتو نایەلێت ئەو تۆوەی ئەی چێنێت چەکەرە بکاتو سەر دەر بهێنێت • ئەمە لەلایەك وەلەلایەکی ترەوە هەندێك پیاو هەیە هیچ نرخێك بۆ ئافرەت دانانێن واهەست ئەکەن تەنها بۆ خزمەتکاری ئەوان دروست کراون ، بەچاوێکی سووکەوە تەماشایان ئەکەن ، لەبەردەم منداڵەکانییدا قسەی ناشیرینی پێ ئەلێتو ئەی شکێنێت ، ئەوانیش وایان لێدێ فێری ڕێز نەگرتنی یەکتر ببن •

بەڵێ : ئیسلام گەلێ مافی گرنگی بۆ ئافرەت

داناوەو بەتووندی بەرگریان لیَ ئەکات ، هەر کەسێك بیەوێت پێشێلیان بکات سزای سەختی بـۆ داناون ·
کاتێك دایك لەخێزاندا دەوری خـــۆی نەبینـــێ یان رێگەی لیَ‌گیرا کەبی‌بینێت ئەوا مەترسی هەلوەشانەوە روو لەو خێزانە ئەکات ·

یائەوەتا ئەو پیاوە لەهیچ کارێکدا راوێژ لەگەك هاوسەرەکەیدا ناکات لەکاتێکدا کەئەویش هاوبەشـــە لەگەلێدا بگرە ئەرکی سەرشانـــی ئەو گرنگتـــرە ئەم جۆرە رەوشتانە سەر ئەکێشن بۆ دوو ئەنجامـــی ترسناك :ـ

یەکەم : پلەو نرخی باوکەکە لای مندالەکـــان نامێنێو هیچ پەیوەندی‌یـــەك لەنێوانیانـــدا دروست نابێت ، ئەو کاتە هەرچ فەرمـــانێك لەوەوە دەربچێت بۆیان لایان گرنگ نی‌یە بەگـوێی بکـــەن یان نا ، هەمیشە چەنە چەنە لەگەل باوکیاندا ئەکەن لەجـــێ بەجیَ کردنی هەر کارێکدا ، واتە : لەمالەوە هیـــچ دەورێکی نامێنێ یاهەر نەبوونی گەلێك چاکترە ·

دووەم : ئافرەت هەمیشە هەوڵ ئەدات تۆڵـــــە نەمێردەکەی بکاتەوە بەهەرچ شێوەیەك بێت ، ئاشکرا بێ یانهێنی ، دەست ئەکـــات بەدوور خستنـــەوەی منداڵەکان لەباوکیان‌و بـــەلای خۆیدا ڕایان ئەکێشێ‌و هانیان ئەدات بۆئەوەی بەگوێی ئەو نەکەن ..

ئابەم شێوەیە ئەم کابرا لەئەنجامـــی هەڵـــەی خۆیەوە لەپەروەردە کردنی خێزانەکەیدا ئەکەوێتـــە گێژاوی مەترسی‌یەوە چونکە ئەو هەنگـــاوانـــەی کەناویەتی بۆجێبەجێ کردنی ئیشەکـــەی هەموویان هەڵەبوون . ئەوەتا یەکێك لەخواناسان ئەڵێت: کاتێك کەسێك داوای سەرکەوتن ئەکات‌و ئەیەوێت ئیشێك بەجێ بهێنێت بەڵام ئەو هۆیانەی کەپێویستن بۆدەست خستنی مەبەستەکەی بەکار نەهێنێت وەك کەشتی‌یەك وایە کەبتەوێ بەسەر ووشکایی‌دا بڕوات .

لەوانەیە لەئەنجامی خوێندنەوەی ئەو چــــەند ووشەیەی پێشەوە پرسیار ێکت بەبیردا بێت‌و بلێی هۆی ئەوە چی‌یە هەندێك باوك هەیـــە موســـڵمانن

وشارەزایی‌یان لەئیسلامدا هەیە وەهیچ درێغی نەکردووە لەپەروەردە کردنی منداڵەکانی‌دا لەسەر شێوەیەکی ڕێك‌و پێك ، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆڵەکانی لایان داوەو دووریان گرتووە لەئیسلام هەروەها لەگەڵ ژنەکانییشیاندا زۆر بەجوانی ڕەفتار ئەکەن‌و هەموو مافێکی خۆیانیان داونەتێ ؟

ئێمەش لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێین :

گومان لەوەدا نی‌یە هەر ئەبێت هۆیەك هەبێت جگە لەو هۆیانەی پێشەوە باسمان کردن ئەویش پەیوەندی هەر بەدایکی منداڵەکانیەوە هەیە ئەم هۆیەش ئەگەڕێتەوە بۆکاتی دەزگیرانی‌و دەست‌نیشان کردنی ئەو کچەی کەئەیەوێ بی‌هێنێت ، جائەگەر هات‌و هەروا بەکویرانە نیشتە مل‌و هەرکە کچێکی بەڕواڵەت جوانی بینی ئیتر یەکسەر بنێرێتە خوازبێنی بێ‌ئەوەی لەهیچ شتێك بکۆڵێتەوە ، وەك ئەوە بزانێ ئایا ئەو ئافرەتە موسڵمانە یان‌نا ، ئایا خێزانەکەی تاچ ڕادەیەك لەخواوە نزیکن ، ئایا بیرو باوەڕیان چی‌یە؟؟!

.... هتد ئەوا هەر ئەڵێ تاکەشتێك لەم جۆرە

خێزانانەوە چاوەڕوان بکرێت کەئەویش بریتــــی یە لەپچڕانی شیرازەی خێزان بەجۆرێکی ئەوتۆ بەهیــــچ شێوەیەك ناتوانرێت یەك بخرێتەوە ٠

کەواتە ئەتوانین بڵێین : هاوبەشی کردنــــی ئافرەت لەگەڵ مێردەکەیدا لـــەپەروەردە کردنــــی منداڵەکانیدا بەستراوە بەڕادەی تێگـەیشتنــــی یـەوە لەئیسلامو نزیکی لەخواوە ، ئافرەتی خواناس هەمیشە هەوڵ ئەدا هاوبەشی مێردەکەی بکـــات لەپەروەردە کردنی ڕۆڵەکانیاندا بەو شێوەیەی پەروەردگارەکەیان ئەیەوێت ، هەردەم بەتەنگ یەکەوەنو لەفەرمانــــی مێردەکەی دەرناچێت مەگەر لەبێفەرمانی خوادا بێ٠

بەم چەشنە هەرکاتێك مرۆڤ ڕوو ئەکاتە ئـــەم جۆرە ماڵانە هەربەوەی سەر ئەکات بەژووردا بۆنــــی خێزانێکی موسڵمان ئەبیستێتو هەست ئەکات بەوەی کەلەبارێکی باوەڕ [ایمانی]دا ئەژی ٠

بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو ئافرەتەی لەخواوە دوور بێت ئەبێتە کۆسپێکی ئێجگار گەورەی بەردەم پیـــار

کاتێك مێردەکەی لەماڵەوە یە واپیشان ئـــەدات زۆر دلسۆزی‌یەتی‌و بەرێك‌و پێکی سەرپەرشتی منداڵەکان ئەکات بەڵام هەرکاتێك ئەو لەماڵ دەرچوو چـــی‌ی بووێت لەفێرکردنی منداڵەکان لەڕەوشـــتی ناشیرین فێریان ئەکات لەئەنجامی ئەوەی دەرگایان بۆئەخاتـە سەرپشت بۆکوێ ئەچن بچن‌و لەگەڵ کێدا هاوڕێ‌یی ئەگرن بی‌گرن • لای پیاوەکەی وادەرئەخات هـەرچ کاتێك ئەو بچێت بۆگەشتێك زۆر بەووردی ئاگـای لەمنداڵەکانی ئەبێت ، یاکاتێك لەمزگەوتەو چـــووە نوێژی کۆمەڵ ـ جماعە ـ بکات کەئەگەڕێتەوە پرسیار لەژنەکەی ئەکات ئەرێ ئافرەت منداڵەکان نوێژەکانیان بەجێ هێنا ؟ ئەویش یەکسەر کەهیچ ڕاستی‌یەکـــی لانی‌یە بەووشەیەکی درۆ وەڵامی ئەداتـەوە بـــەڵێ پیاوەکە هەرکاتێك بانگ ئەدات یەکســـەر دەست نوێژ ئەگرن لەماڵەوە یالەمزگەوتەکەی نزیکی خۆمـان نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن •

کاتێك پیاوەکە لەماڵ دەرئـەچێ بەژنەکـــەی ڕائەگەیەنی کەئاگای لە تەلەفزیۆنەکە بێت بامنداڵەکان

خەریك نەبن بەو فلیمانەوە کەزیانیان هەیە بۆیـــان کاتیك لەماڵ وون بوو بەئارەزووی خۆی بۆیان ئەکاتەوەو پێیان ئەڵێ هەرکە باوکتان هاتەوە خێرا بیگــۆڕن یان بی کوژێننەوە باوا بزانێ داواکەتان بــەجێ هێنــاوە کاتێك پیاوەکەی دێتەوە پرسیاری لێ ئەکات دەربــارەی ڕاسپاردەکانی ئەویش لەوەڵامدا ئەڵێ : بەڵێ هەمـــوو شتێك بەوشێوەیە کەتۆ ئەتەوێ ، بگرە گەلێك جــــار شتی وەها دەربارەی منداڵەکانی لەمێردەکەی ئەشارێتەوە هەتا خۆیشی بەم کارانەیان ڕازی نی یەو حەز ناکــات پێی هەڵسن • پیاوەکــەبیش وائەزانێ هەرشتێـــك دەربارەی خێزانەکەی ئەزانێ بەڵام لەڕاستیدا جگــــە لەچەند شتێکی کەم ئاگای لەهیچ نی یە •

سەرەڕای ئەمانە هەمووی منداڵەکانــی فێــری هەمان بەدخویی و فێڵ و درۆو دەلەسانەئەکات منداڵــێ بەستەزمانیش لەئەنجامی ئەم جۆرە کارانەوە ڕێگــــا وون ئەکات و سەر لێشێواو ئەبێ و دوور ئەکەوێتــەوە لەپەروەردەی ئیسلامی •

زاناكانی دەروون ـعلماء النفسـ وكۆمەڵایەتی
یەكان باوەڕیان وایەكەخاڵێ منال ومنالێ خاڵ زۆر كار
ئەكەنە سەر مندالێ خوشك ، وەشتێكی ئاشكرایـــە
كەمندال زیاتر پەیوەندی بەدایكی‌یەوە هەیە هـــــەتا
باوكی وەزیاتر تێكەڵاوی‌یان لەگەل كەس‌و كاری دایكدا
هەیە هەتا كەس‌و كاری باوك، لەبەر ئەوە ئافرەت‌هەمیشە
حەز ئەكات سەر لەكەس‌و كاری بدات‌و تێكەڵاوی یان
بكات‌و سەریان لێ‌ئەدات‌و ئەوانیش سەر لەم ئـەدەن
ئەویش حەز ئەكات كەس‌و كاری بەتایبەتی براكانـــی
خۆشەویست بكات لای مندالەكانی جائەگـەر هـات‌و
كەس‌و كاری ئافرەتەكە موسلمان نەبوون وەڕێگـــای
جگە لەڕێگەی خوایان بۆخۆیان هەڵبژاردبوو ئەوا وردە
وردە كار ئەكەنە سەر مندالەكانی ئـەم‌و لەسـنووری
خوا ئەیان ترازێنن بیرو باوەڕەكانی خۆیانیان ئەخەنە
مێشك بەشێوەیەكی وا كەباوكیـان هیچ هەسـتیان
پێ‌نەكات هەتا كۆسپی گەورەی بۆیەتە مەیدان‌و ناتوانێ
مرۆڤی موسلمان هەموو جـۆرە ئامادەیی‌یەك
وەرئەگرێت بۆئەوەی خێزانەكەی بگەیەنێتە ئـــەو

جێگاپەی کەخۆی ئەیەوێتو لەهەموو ڕەشەبایەکـــی
نەفامی بی‌پارێزێت چونکە لەدەرەوەیشدا تووشـــی
گەلێك گۆسپو هەڵدێرو گیرو گرفت ئـەبێت وەك :
هەندێك لەمامۆستای قوتابخانەکان نایانەوێ قوتابـی
بەخوو ڕەوشتی جوانی ئیسلامی برازێنەوە بەڵکـــو
هەندێك باوو نەرێتـــی لەدەرەوە هێنراو یاخـــود
دەستکردی ناوخۆی ئەوتۆ فێری منداڵان ئەکـــەن
کەبەیەکجار مانای ڕەوشتو خویان لـــەلا نەمێنێتو
هەمیشە چاو نوقاو بن‌و هەرکەس بێت لـــەم لاو لاوە
بەئارەزووی خۆی شتیان فێر بکات ٠

بەڵێ : باوکی لێهاتو هیچ کات بێ‌ئاگا نی‌یـــە
لەم جۆرە پیلانانەی کەئەکێشرێن بۆلێدانـــی

ئیسلام لەرێگەی منداڵەکانی ئەوەوە بۆیـــە
هەموو دەم هەڵئەسێت بەوەی بەرگری بەمنداڵەکانی
پەیدا ئەکات ئەویش بەهۆی گۆش کردنیان بـەشیری
ئیسلامو هەرکات میکرۆبی ترسناك ڕووی تێکـــرد
ناتوانێ لەبیرو باوەڕی ئەودا جێی خۆی بکاتـــەوەو

دەور ببینێت ، کوتو پڕ ئەبڕێتو فرێ ئەدرێتـــــە
دەرەوەو ئەخرێتە گۆڕ ....

پێویستە باوك هەندێك لەکاتەکانی تەرخـــان
بکات بۆدانیشتنی لەگەڵ منداڵەکانیداو یەکەبە یەکـــە
هەموو ڕۆژێك پرسیاریان لێبکات ئەو ڕۆژە چی‌یـــان
وەرگرتوە لەقوتا بخانە ؟ هاوەڵی لەگەڵ کێداو بۆچی
ئەکەن ؟

بەووردی بکۆڵێتەوە لەخێـزانی هاوەڵەکانیـــان
جا ئەگەر دوور لەخوا بوون ئـەوا تێ‌یـــان بگەیەنێت
لەخراپی‌بەکانی ئەو جۆرە هاوەڵی‌یانە . بەڵام ئەگـەر
هاتو مووسڵمان بـوون ئـەوا ئەبێ زۆر بەچاکـــی
هانیان‌بدا تاپەیوەندی‌یان لەگەڵیاندا بەهێز بکـــەنو
دۆستایەتی‌یەکەیان بتەو بکەن .

جا ئەبێ ئەوە لەقوتابخانە وەریان گـــــرتووە
بەراوردی بکات لەگەڵ بەرنامەکەی ئیسلامدا تابزانــێ
تاچ ڕادەیەك ئەگونجێت لـەگـــەڵ ئـەو پەروەردە
کردنەی کەئەم پێوەی خەریکە لەنـاو خێزانەکەیـــدا

لەپاشمان بەشێوەیەکی نەرم ونیان دەست بکـــات بەووتەو وێژ لەگەڵیانداو هەرچ بیروڕایەکـــی لارو هەڵەو چەوتیان وەرگرتوە بـۆیان ڕاست بکـاتەوە ، تا گاداریان بکاتەوە لەمەترسی ئەو شتە چەوتانــەی کەوەریان گرتووە لەدوور خستنەوەو ترازاندنیـــان لەسەر ڕێبازەکەی خوای گەورە • ئـەم کـــارە پێویستی‌یەکی ئێجگـــار زۆری بەئـــارام گرتـــن‌و ووردە کاری هەیەو هیچ کەم تەرخەمی‌و تەمەڵێ نەکات ئەگینا هەموو ڕەنجەکەی بەبا ئەچێت‌و ڕێسەکـــەی ئەبێتەوە بەخوری ، چونکەئەمە ئەرکێکی گرنگـــەو لەلایەن خواوە خراوەتەئەستۆی •

پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلى الله عليه وسلم ئەفەرموێت هەمووتان وەك شوان وان‌و هەریەکـــــە لێ‌پرسراوە لەبەردەستەکانی (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته •••)•

هەندێك جار وائەبێ ئەو مندالآنــە لەڕێگـــای ڕاست لابدەن‌و ئەو پەروەردەیە بەفیرۆ بچێ بەهـــۆی

هێنانی هەندێك پەڕاوو گوڤار ـ مجلة ـ وە بیروباوەڕی دژ بەئیسلام هەڵئەگرن‌و خوو ڕەوشت تێك‌ئەدەن لەناو خێزاندا . چارەسەر کردنی ئەم گیرو گرفتانە بەوە نابێت‌هەڵسێت بەدڕان‌و سووتانی ئەو پەڕاووگۆڤارانەو منداڵەکان بداتە بەرشەق‌و جنێو بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەبێ لەگەڵیاندا دابنیشێت‌و هەموو ئەو باسانەیــــان بۆڕوون بکاتەوە وەتێیان بگەیەنێت ئەمانە نوسراوی دەستی دوژمنانی ئیسلامـــن‌و ژەهـــری کوشندەن‌و مەبەستی قەلاچۆ کردنی ڕۆڵەکانی موسلمانەکانە ، ئەو کاتە منداڵەکان لەڕاستی تێ‌ئەگەن‌و ئەزانن باوکیـــان سوودی ئەمانی ئەوێت . بەڵام پەنا بردنەبەر تونــدو تیژی واڵەمنداڵەکان ئەکات ئەو نوسراوانــە بــەدزی باوکیانەوە بخوێننەوەو بگرە زیاتر سور ئەبن لەسەری

لەپاشان پێویستە ئەو بۆشایی‌یانەیان بەپەڕاوو گۆڤاری بەسوود بۆپڕ بکاتەوە تامێشکیان وورپـــــا ببێتەوەو زانیاری‌یان زیاتر بکات‌و چاویان بکرێتـــەوە بۆئەوەی ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان باوکیان بچڕا لێیان

خۆیان بتوانن دەردی خۆیان تیمار بکەنو ڕاستی لەچەوتی جیا بکەنەوە یاباماناکیەکی تر ئەو کتێبانە هەموویان ئەبنە یارمەتی دەرێکی بەهێزی باوکەکە لەپەروەردە کردنی منداڵەکانیدا .

هەندێك جار منداڵ لەپلەی ناوەندیدا لا ئەدات لەئەنجامی تێکەڵاو بوونی لەگەڵ خەڵکێکی زۆرو توش بوونی بەهاوەڵانی خراپەوە ، جائەبێ هانیان بدات لەگەڵ قوتابییە موسڵمانەکاندا بگەڕێنو کاتی بێئیشی لەگەڵ ئەواندا بەرنە سەر ، بەڵام ئەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کاتێك منداڵ لەپلەی سەرەتاییدا یەئەبێ سەرپەرشتییەکی تەواوی بکرێت ئەوکاتە بەچونە ناو دۆخی ناوەندیو ئامادەیی بگرە زانکۆیشەوە هەردامەزراو ئەبێتو هیچ شتو کەسێك ناتوانێ بیگۆڕێت مەگەر بەدەگمەن ، جائەگەر هاتو ئێمە لەسەرەتادا منداڵەکانمان بەرەڵا کردو خۆمان بێئاگا کرد لێیان هەتا ئەگەنە پلەی ناوەندی ئامادەیی ئەوسا دەست بکەین بەپەروەردە کردنیان ئالەم کاتەدا تووشی

کەلێك گیرو گرفت ئەبین چونکە کاتێك ئێمە ئەمانەوێ
بیروباوەڕی ئیسلام لەمێشکیاندا جێگیر بکەین تیایا
جێگای نابێتەوە لەئەنجامـــی پڕبوونـــی بەگـــەلێك
بیری ترەوە لەکاتی بێئاگایی یەکەی ئێمەدا ..

چاکتر وایە بۆپڕ کردنەوەی کاتی بێئیشی باوك
مندالەکانی بەرێت بۆگـــەڕان و ســـەری شوێنــــە
گشتی یەکانیان پێبدات وەك باخچە کشتی یەکـــان ،
مۆزەخانە ـ متحفـــەکان، گۆڕەپانی یاری ، هەروەهـــا
مانگی جارێك یا دوومانگ جارێك بیان بات بۆ سینەما
بۆ بینینی هەندێك فلیمی جەنگی بەمەرجێك دوور بنت
لەمەترسی تێکدانی خووڕەوشتیان ئەمەیش بونـەوەی
تاخۆیان بەتەنها یالەگەل هاوەلــێ خراپدا نەڕۆن .
دیسان ئەبێ بۆیان ڕوون بکاتەوە کەسینەمـــا لـــەم
ڕۆژەدا دەوری نێکدانی ڕەوشتو شەروال پیســـــیو
پیاو کوشتن و دەوری هەلوەشانی گۆمەل ئەبینێت...
هتند . ئەبێ ئەوشتانەیان بۆ شی بکاتەوە لەسینەمـــا
بینی یان بی بەستێ بە ئیسلامەوەو بەســـوود لـــەبـــی
سوود جیا بکاتەوە . چالەبەرئەوە مندال هەمیشـــە

حەز لەشوێن کەوتنی هەواو ئارەزووی ئەکات بـــەم شێوەیە پایان بهێنێت تادل دامەزراوبێ٠ بەم جـــۆرە پەروەردەکەر خێزانەکەی لەژێر چاودێری خۆیدا بەرەو پێشەوە ئەبات‌و هەمیشە ئاواتی ئەوەیــە بەشێوەیەك بژین لەماناى بەندایەتی بۆپەروەردگار نێبگەن ٠٠٠

پەروەردەکەر نابێ تەنها بەو چەند ووشەیــەی سەرەوە باسمــانکـــرد واز بهێنێت وەپـــاش دوور خستنەوەی ئەولاری‌و چەوتیانەی ڕوو ئەکاتە خێـــزان پالێ لێبداتەوەو وابزانێ ئیتر کارەکەی تەواو بووە بەلکو پێویستە هەربەردەوام بێت لەکارەکەیدا ڕەنگ بداتەوە بڕازێنێتەوە بەباوەڕ بەخوای تاك‌و تەنها ٠٠

پێش هەموو شتێك ئەبێ هەول بدرێت لـەسەر شێوەیەکـی ڕاست‌و دروست خـوای گـەورەیـــان پێبناسرێت ، چالەبەرئەوە هەر لەسەرەتاوە ـ فطرة ـ موسلمـــانە کەواتە مندال ئامـادەیە بـۆوەرگتنـــی هەمـوو شتێك‌و ڕووداوێك بۆیــە دەبینین ئەیەوێت هیچ گومانێ نەمێنیت بەرامبەر بەوشتانەی کـەئەیان بینێت دەست ئەکات بەپرسیار کردن لەوشتانـــەی

کەنایان زانێت هەست ئەکـــات بەوەی کەئـــەبێ ئەم هەموو دروست کــراوانە دروست کەرێکیـــــان هەبێت • بۆیە پێویستە لەسەر باوکی هەر لەسالآنی سەرەتای ژیانی‌یەوە زمانـــی بـــەووشەی خـــوا (الله) بکاتەوە بێ‌ئەوەی هیچ درێژەی بداتێ‌و بۆی باس بکات باهەر بەم شێوەیە لەگەلێدا بڕوات هەتا ئەیگەیەنێتە پلەی شەش سالێ لێرەدا سرنجی ڕابکێشێ بۆهـــە موو دروست کراوەکانی دەورووبەری لەئەرزو ئاسمان‌و مانگ‌و خۆرو ئەستێرەکان لەلایەن ئەو ناوەوە کەئەو ئەیزانێ کەبریتی بوو لەخوا ـ الله ـ ئەوکاتە بەزویی شتەکان وەرئەگــرێت ووشەی خوا زیـــاتر بەدلـــــە بچکۆلەکەیدا ڕیشە دائەکوتێت •

جاهەر کاتێك ئەو مندالە لەتەمەندا بەرەو پێشەوە ڕۆیشت ئەوا ئێمەش باسەکەی بـــۆزیاد ئەکەیــــن پەیوەندی بخەینە نێوان خواو دروست کراوەکانـــەوە تالە مێشکیدا جێگیر بێت کەدروست کەری هەموو ئەم بوونەوەرە خوای گەورەیە • ئەگەر بـــەم شێوەیــــە بڕۆبیشتو دروست کەری ناسی ئەو کاتە پێویســـتە

بگوێزرێتەوە بۆقۆناغێکی تـــر ئەویش بریتـــی‌یە لەبەندایەتی‌و پەرستنی ئەو خوایەی کەئەو بـاوەڕی پێ‌هێناوە ـ ئەلەم کاتەدا پێش هەمـوو شتێك نوێـــژ سەر دەرئەهێنێت‌و پێویستە لەسەر خۆ هـەولیـــان لەگەلدا بدات بۆفیربووونی بـەلام بێ‌ئەوەی بەهیـــچ جۆر پەلەیان لێ‌بکات بەقورسـی بیخاتە پێش چاویـان هەندێك لەباوکان نازانن چـۆن نوێژ خۆشـــەویست بکەن لای منداڵەکانیان هەروا ئەزانن بەوەی کەپێیان بلێن ڕۆڵەگیان نوێژ بکەن هەمەو کارێك تەواو ئەبێ .

نەخێر : وانی‌یە ، چونکە نوێژ کردن گەلێـــك لەوە گەورەترە کەئێمە لێی تێ‌گەیشتوین بەلکـــــو پێویستە باوك هانی منداڵەکانی بدات‌و خۆی پێشیان بکەوێت‌و بەکۆمەل نوێژیان بۆبکات لەماڵەوە ، یـــان لەگەل خۆیدا بیان‌بات بۆمزگەوت‌و فیری ئەوێیان‌بکات ئالەم کاتەدا منداڵ‌هەست ئەکات بەوەی گەلێك خێزانی‌تر هەیە خەریکی ئەم کارەی ئەمانن ، لەمزگەوت گەلێـــــك منداڵێ وەکو خۆی ئەبینێت کـەئەوانیش وەکـــو ئـەم هـاتوون بـۆئەوەی سـەری بەنـدایەتـــی

بۆپەروەردگارەکەیان دابخەن ، بەمە باوەڕەکەی بەخوای گەورە هێندەی‌تر بەهێز ئەبێت وهەست بەیەکێتی‌یەکی بێ وێنە ئەکاتو زیاتر سوور ئەبێت لەسەر ناسینی خوای گەورە •

منداڵ لەم کاتەی ژیانیدا لەبەرئەوەی زۆر ئەجوولێتەو یاری ئەکات پێویستە باوکو دایک نوێژەکان بخەنەوە یادی کورپەکانیان بۆئەوەی نەوەك لەبیریان بچێت ، بۆئەوەی تانوێژ ببێت بە بەشێکی گرنگ لەژیانیان چونکە نوێژ یەکێکە لەگەورەترین پایەکانی ئیسلامو بەهێزترین پەیوەندی‌یە لە نێوان پەروەردگارو مرۆڤدا • خوای گەورە لەقورئانی پیرۆز لەگەلێك شوێندا باسی نوێژ ئەکاتو بایەخێکی ئێجگار گرنگی پێ داوە لەهەموو (عبادة) کانی تر •

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلى الله عليه وسلم ـ موسڵمانەکان ئەترسێنی بەئەنجامی وازهێنان لەنوێژ کردن •

پێویسته لەسەر پەروەردەکەر هەمیشە ئاگای لەمنداڵەکانی بێت بۆئەوەی بەردەوام بن لەسەر ئەم کارەو هەموو کاتێك مەشقیان پێبکات لەسەری بێ ئەوەی هیچ سستیو ماندوو بوونێك رووی تێبکاتو بایەخێکی تایبەتی پێبدات چونکە نوێژ بنکەی دەرچوونی مرۆڤی موسڵمانە بەرەو ئیسلام ، چ کاتێك بەقولێ لەنوێژدا چوویە خوارەوە ئەوا بەرگری لێ ئەکات لەهەموو کارێکی ناڕەوا ، جائەگەر نوێژ ئەم دەورەی لە ژیانی مرۆڤدا نەبیبنی ئەبێ بزانین ئەو نوێژە تەواو نییەو چاکتر وایە بگەڕێین بەشوێن ڕاستییەکەیا ، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ : (ان الصلاة تنهي عن الفحشاء والمنكر ) .

کاتێك واز لەنوێژ هێنرا خراپە لەهەموو لایەکەوە ڕێگا بەمرۆڤ ئەگرێت چونکە بەم کارەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ خوادا ئەپچڕێتو سەر پێچی خۆی لەفەرمانی خوا ڕائەگەیەنێت ، خۆی بێبەری ئەکات لەبەخششی بەندایەتی بۆ پەروەردگار .

یەکێك لەگیرو گرفتی پەروەردەکەری موسڵمان لەم ڕووەوە ئەوەیە کەهەر لەسەرەتاوە ڕاهێنـــــانی منداڵەکانیان لەسەر نوێژ کردنو بەندایەتی‌یەکانی تــر ساڵ لەدوای ساڵ دوا ئەخەن بەنیازی ئەوەوە کوایـــە کاتێك گــەورە ببن خۆیــان بیر ئــەکەنەوە یـــان خیزانەکەیان کەدۆخێکی ئیسلامی هەیــە کاریـــــان تێ ئەکاتو ژیانیان ئەگۆڕێت ، ئەبێ ئەوە بزانیـــن کەئەم جۆرە کەسانــــە بەهــــەڵەدا چــوونو لەتەمــەنی خۆیانەوە ئەیانــەوێت ڕۆژ لـــــــەدوای ڕۆژ بەم‌کارەیان خۆیان بخەڵەتێنن ، چونکە هەروەکــو لەپێشەوە باسمان کرد لەکاتێکا ئــەم بێ‌ئاگایـــــە لەگەیاندنی ئاینەکەی بەڕۆڵەکانی ٠

دوژمنەکانی ئیسلام بێدارزو هەلیان لەبەردەمدا پەیدا ئەبێت بۆڕشتنی ژەهری بـێ‌باوەڕی خـــۆیان لەمێشکی ڕۆڵە موسڵمانەکاندا ٠

چونکە ئەو باوەڕەی ئــەمڕۆ مرۆڤی تێــدا ئەژی هەمــووی شێوەیەکی نــەفامی ـ جاهلی ـ هـــەیــەو لەگشت گۆشەکانی ژیاندا جێگەی خۆی کردوەتەوە ،

منداڵیش کاتێ هەر لەسەرەتای ژیانی‌یەوە تیـــــایدا بووە بەتەواوەتی دەقـــی پێوە ئـەگرێت و ئەیکـــــات بەبەرنامە بۆژیانی ڕۆژانەی خۆی ئەمەیش لەئەنجامی نەبوونی بەرگری‌یەکـــی پێویست کـەبریتی‌یە لەژیان لەگەڵ پەروەردگاراو دەست پێ‌کـــردنی ژیان بـــــەو شێوەیەی کەئەو ئەوێت ، ئەنجا تووشـــی گەلێـــــک نەخۆشی دەروونی ئەبێت و لەهەموو لایەکەوە لایەنگرەکانی شەیتان ڕێگای پێ ئەگرن و ئەوەندەی تر لەڕێگـــــای ڕاست ئەیترازێنن ، وای لێ ئەکەن ئەوەی کەهـــــەر بەبیریدا نەیەت بریتی بێت لەناوی خـــوا ، واتــــــە تۆ لەم کاتەدا خاوەنی منداڵەکانت نیت چونکە هــەر لەسەرەتاوە نەت توانیوە خاوەنداریتی‌یـــان بکـــــەیت لەناوخێزانەکەتدا لەو دەمـــەدا کەهـــەرخۆت بوویت ، هەرچ شتێکت پێ‌بوتنایە لەفەرمانت دەرنـــەئەچـــوون ئێستا خاوەنیان بۆ دروست بووە لەدەرەوەدا ، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆژ هەتا ئێوارە هەوڵ ئـــەدەیت و عـــارەق ئەرێژێت تاپارە پەیدا بکەیت و بیان ژیەنیت کەچـــی لەولاوە قازانجیان بۆ خەلکی هەیە ، واتە: تۆ بەخێویان

ئەکەیت و لەدەرەوە کەسانێکی تر بەکاریان ئەهێنن بۆخزمەت کردن بەبیرو باوەڕەکانیان بەو شێوەیەی کەبیانەوێت گۆشیان ئەکەن . تۆیش دەوری کرێکارێکی بێحەق و مز ئەبینیت و دڵت بەوە خۆشە منداڵت هەیەو شانازی یان پێوە ئەکەیت لەناو خەڵکیدا فلان کوڕم قوتابی یە لەپۆلی ئەوەندە ، فلان کوڕم خەریکە ئەبێت بەمامۆستا ، فلان کچم ئەمەیەو فیسارە منداڵم ئەوەیە .. هتد .

بێ لەوەی بەخۆت بزانی دز هاتووەتە ماڵەکەتەوەو هەموو زێرو زیوەکانی دزیویت تۆیش هەر گۆرانی بەبالایاندا ئەڵێیت بێ ئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان بچیت سەرێکیان لێ بدەیت تابزانی چی یان بەسەر هاتووە ، بۆدڵنیا بوونت لەپارێزراوی شوێنەکەیان ...

لەبەر گرنگی کارەکەمان ئەبێت منداڵ هەر لەیەکەم ڕۆژی ژیانیەوە بپارێزرێت لەو میکرۆبانەی کەتووشی نەخۆشی باوەڕی ئەکەن و دوژمنانی ئیسلامی پێ بناسێنن ، هەروەك سەربازێك لەسەنگەرەکەیدا بەرگری پێ پەیدا بکەین .

ئەگەر ئێمە توانیمان لەدڵێدا باوەڕێکی ڕاستو دروستمان جێگیر کرد ، زانیاریەکی پاکمان فێرکردن ، خۆراکی ئیسلاممان دەرخوارد دان ئەوا بەبەهێزترینچەکەوە ئەچنە ناو کۆمەڵەوەو هیچ کەسێك ناتوانێ بەرامبەریان بوەستێت تاباوەڕەکەیان لێ بدزێت ، چونکە بەجوانی باوەڕیان بەو شتە هەیە کەلەسەری ئەژینو باش لێی تێگەیشتوون .

پێویستە زانیاریی لەبارەی ئیسلامەوە زیاد بکات ، باشتر وایە پێش هەموو شتێك لەگەڵ ژیانی پێغەمبەردا - صلی الله علیه وسلم - بیژیەنیتو سەرنجی ڕابکێشێ بەلای ژیانی هاوەڵە خۆشەویستەکانیدا (درودی خوایان لێبێت) چۆن تێکۆشاون لەپێناوی خواداو لەو ڕێگایەدا سەرو ماڵیان بەخت کردوەو نمونەیان بۆبهێنێتەوە تاتێبگەن موسڵمانە پێشووەکان چۆن هەموویان بەشێوەیەکی برایانە لەژێر سێبەری قورئاندا ژیانیان بەسەر بردوەو هەمیشە بەتەنگ یەکترەوە بوون . بەم شێوەیە

منداڵ چاکتر تێئەگات وەهەموو ڕووداوەکان دێنە پێش چاوی .

منداڵ زیاتر حەز لەوە ئەکات ڕووداوەکانی بەشێوەی چیرۆك بۆبگێرێتەوە چونکە هەرگیز لەبیری ناچێتەوە ، لەگەڵ گەورەبونی منداڵدا پێویستە باسەکانی بۆزیاتر بکرێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ تەمەنو ژیری‌یدا بگونجێت وەرێگای بۆڕۆشن بکرێتەوە بۆئەوەی خۆیشی دەست بکات بەخوێندنەوە تاوای لێدێ زیاتر چاوی ئەکرێتەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرێت ، هەمیشە حەز بەزانینی ئەو شتانە ئەکات کەنایان زانێتو زیاتر داوای پەڕاو ئەکات تابیان خوێنێتەوە ، ئێمەیش ئەمەمان ئەوێت ، ووردە ووردە وای لێدێ لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاری‌یانەدا کەوەری گرتوە ڕەوشتی مرۆڤێکی موسوڵمان لەخۆیدا بهێنێتە دێ .

یەکێکی‌تر لەگرانگترین قۆناغەکانی ژیانی منداڵ بریتی‌یە لەقۆناغی (بالغ ـ مراهقه) بوون ، چونکە لەم پلەیدا هەموو ئەندامەکانی لەشی پێئەگەنو

گەشە ئەکەن‌و هەمیشە لەبیر کردنەوەدایە ، بۆیـــــة
پێویستە لەسەر پەروەردەکەر بەووردی ئاگای لێ‌بێت‌و
ئەوەی پێویستە بۆی بەکار بهێنێت ـ وەهەر لـــەم
کاتەدا ئەکەوێتە پرسیار کردن بەووشەی کێ ؟ کەی ؟
بۆچی؟ چۆن؟ نابێ واهەست بکەین کەئەم لاوە لەئیسلام
لای‌داوە چونکە ئەوە شێوەیەکە لەشێوەکانـــی ئـەو
قۆناغەی کەتیایا ئەژی ، چاکتر وایە زۆر بەچــــاکی
گوێیان لێ‌بگرین‌و وەڵامی پرسیارەکانیان بـــەوپەڕی
دڵفراوانی‌یەوە بدەینەوە بەبێ هیچ جۆرە هەڵچـوون‌و
تووڕە ـ بوونێك ، تاوانباریان نەکەین بەوەی کەتێـ
ناگەن‌و نەشارەزان لەئیسلام • ئەگەر وەڵامی تەواویان
دەست‌نەکەوت ئەوا گومان‌و دوودڵی ڕوویان تێ‌ئەکات،
لەپاشدا ئەچن پرسیار لەیەکێکی نەشارەزا ئەکـەن‌و
ئەویش‌نازانێ وەڵامی‌بداتەوە‌ئیتر وائەزانێ پرسیارەکەی
وەڵامی نیەو لەئەنجامدا سەری لێ‌تێك ئەچێت‌و لەخوا
دوور ئەکەوێتەوە • یاوائەبێ هەندێ جار ڕێیان لـەو
کەسانە ئەکەوێت کەدوژمنی ئیسلامـن‌و بیروباوەڕی
نەزانی ـ جاهلی‌یان ـ هەڵگرتووە ، ئەوانـــــەیش

بوعەلێکی ئاوەها ئەگەڕێن تاگومان زیاتر لەدڵــــــی
لاوەکاندا بلاو بکەنەوەو پالێان پێوە ئەنێن تا باوەڕیان
بەخوایەتی خوا نەمێنێت ٠٠ ئەگـــەر پەروەردەکـــەر
زانیاریەکی ئەوتۆی ئەلا نـەبوو کـــەوەلامـــی
پرسیارەکانیان بداتەوە ئەتوانێ پەنا بەرێتە بەر ئـەو
موسڵمانانەی کەوا شارەزایی باشیان لەئیسـلامـــدا
هەیە یاخود منداڵەکانیان بناسێنن بەو جۆرە کەسانە
تاهەموو کات ئەگەر گیرو گرفتێکیـــان هەبێت بۆیان
چارەسەر بکەن ، چونکە ئەو جۆرە مامۆستایانـــە یان
ئەو کەسانە هەمیشە پرسیاریان ئاراســـتە ئەکرێت
لەهەموو ڕووبەکەوە ئەوانیش زۆر بەدڵ فراوانـــیو
لێهاتوولییەوە وەلامیان ئەدەنـەوە چونکـــە ئەمـــە
ئیشیانە ٠

ئەم جۆرە مامۆستایانە گرنگی بـــەم پرسیارانە
ئەدەنو بەباشی گوێ بۆخاوەنەکەی رائەگرێت وەڕێز
بۆ خۆیی و قسەکانی دائەنێت ، وەلامەکەی بەبەلگـەی
گرنگك ئەڕازێنێتەوە جاچاکترین هۆ قورئانە تامندال
لەم قۆناغەداو لەهەموو قۆناغێکیتردا لەگەلێدا یـــژی

چونکە دەستی ئەگرێتو لەھەموو کۆسپو هەڵدێرێکی ژیان ڕزگاری ئەکاتو نایەڵێت سەری لێ بشێوێت ....

پێویستە لەسەر پەروەردەکەری ڕۆشنبیر، لە مالەکەیدا کتێبخانەیەکی ئیسلامی هەبێت بەگوێرەی توانا بابچوکیش بێت ، لەوپەڕاوانەی تێدا دابنێت کەخێزان پەروەردە ئەکات لەسەر خووڕەوشتێکی ئیسلامیو زانیاری یەکی ڕاستو دروستیان ئەداتێ، وەئەبی بایەخێکی چاکی پێبدرێت ، هەروەك چۆن هەول ئەدرێت بۆپەیدا کردنی خۆراكو بۆشاك بۆیان.

گەلیك پەڕاوی تازەی بەکەڵك کەوتوەتە بازارەوە . کەدەوری یالا ئەبینن لەدامەزراندنی دلێ موسلماناداو هەریەکە لەگۆشەیەك ئەدوێت پڕن لەزانیاری بەکەلك وەك :ـ قصة الایمان = چیرۆکی باوەڕ ، عقیدة المسلم = باوەڕی موسلمان ، اگەشتەکەم لەگومانەوە بۆباوەڕ ، العلم یدعو للایمان = زانیاری بانگی باوەڕ هێنان ئەکات ، الله یتجلی في عصر العلم = خوا لەچەرخی زانیاریدا دەر ئەکەوێت، الله

والطب الحديث ، الله والعلم الحديث ، القرآن والعلم الحديث ، المسلمون والعلم الحديث ، الطب محـراب الايمان ، لەسەرەڕێی کاروانی باوەڕا ، جیهانێکـــی وون ئادەم پێغەمبەر ، عمیری کوڕی سەعد، نوسەیبە، ٠٠٠٠ هتد ٠٠

ئەگەر هاتو منداڵ لەتەمەنـــی مراهەقــــەدا چاودێری یەکی ووردی لێوە بکرێت ، ڕێگـــا نەدرێت هەتا ئەم قۆناغە کاری تێبکات ، بەم چەشـــتە دوای ئەم ماوەیە ئیتر دامەزراو ئەبێت، مرۆڤێکی ڕێكوپێکی ئاودراو بە ئاوی خووڕەوشتی ئیسلامی لێدەرئەچێت لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەر ـ صـــلى الله عليه وسلم ـ ئەڕوات بەڕێوە بەشێوەیەکی ئەوتۆ بەجۆرێك هیـــچ شتێك ناتوانێ لێی بترازێنێ ـ لەکاتێکا ئەم مرۆڤـە ئەکەوێتە با ـ «جو» یێکی بێباوەڕی یەوە یەکســـەر بەهۆی ئەو ڕووناکی یەوە لەدڵیدایە کەبریتـــی یـــە لەخۆشەویتی خوای گەورە ، خۆی ڕزگار ئەکـــاتو ئەی گێرێتەوە ژێر سێبەری پەروەردگارەکەی لەپەنای قورئاندا ٠

ئەبێ پەروەردەکەر ئەوە لەپێش چاوی خـــۆیدا دابنێت لەکاتی پەروەردە کردندا کەدۆخێکی ئیسلامی لەخێزانەکەیدا بهێنێتە دی لەڕێگەی پەیوەندی دانــی هەموو شتێك بەئیسلامەوە بۆنمونە:هەرچ کارەساتێك ڕوو ئەدات ، یان شەڕێك بەرپا ئــــەبێت ، پەڕاوێك دەرئەچێت ، یەکێك قسەیەك ئەکـات ، بیروپاوەڕێك دێتە کایەوە ، فلیمێك پیشان ئەدرێت لەسینەمـــا ، یالەتەلەفزیۆندا ، پێویستە هەمووی ڕوون بکاتـــەوە تاچڕادەیەك لەگەڵ ئیسلامدا ئەگونجێت یان ناگــــو- نجێت .

چونکە ئەبێ موسڵمان هەموو شتێکی تەنهـــــا هەرلەئیسلامەوە بێتو بەدەوری ئەودا بسوڕێتـــەوە هەروەك چۆ گەرما بەگەرماپێـــو ئەپێوورێت ، هەرچ شتێك لەگەڵ ئیسلامدا بێت ورەی بگرێت ئەوەیشــی پێچەوانەی بێت وازی لێ بهێنرێت بەڵکـــــو لەدژی بوەستێت ، بەمە مرۆڤی موسڵمان تەنها هەربە ئیسلام ڕازی یەو جگە لەو نرخ بۆهیچ کەسو شتێك دانانێت نەگەربێتو لەگەڵ خوادا نەبێت، ئەمەیش هەرلەخۆیەوە

لای مرۆڤی خواناس دروست نەبووە بەڵکو ڕاستییەکە لەناخی دەروونیەوە پاڵی پێوە ئەنێت کەئەبێت بەم شێوەیە بێت •

بەڵێ : بەم شێوەیە پەیوەندی نێوان پەروەردگارو بەندە بەهێز ئەبێتو خوا لەخۆیانی نزیک ئەکاتەوە کەواتە دەوری پێغەمبەرانیش – دروودی خوایان لەسەربێ – هەمان شێوەی بووە • خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ :

« لَقد جاءَكم منَ اللهِ نورٌ وكتابٌ مُبينٌ يهدي به اللهُ مَن اتَّبعَ رضوانهُ سُبلَ السَّلام ويخرجهمُ من الظلمات الى النّور بأذنه ويهديهم إلى صِراطٍ مُستَقيم » •

واتە : لەلایەن خوای گەورەوە قورئانتان بۆنێرراوە وەك ڕووناکی وایە ، هەرکەس بەپێی ڕەزامەندی خوا بجولێتەوە ڕێنموویی بۆئەکات بەفەرمانی خۆی لەتاریکی دەریان ئەکات بۆڕووناکی

ئیسلام و ئه‌یانخاته سه‌ر ڕێگای ڕاست ..
وه‌ئه‌فه‌رموێت :

« وأنَّ هذا صراطي مُستقيماً فاتبعُوهُ ولا تتبعُوا السُبل فتفرقَ بكم عن سبيلهِ ذلكمُ وصاكمَ بهِ لعلكمُ تتقون » صدق الله العظيم .

## برای شیرینم پەروەردەکەری خێزانی موسولمان •

ئەمەی باسمان کرد بریتی بوو لەچەند ڕاستیو ئامۆژگاری‌یەك ، جالەبەر ڕۆشنایی‌یاندا هەوڵ بدە دەست بەپەروەردە کردنی خێزانەکەت بکەیت، بۆئەم مەبەستە ئەبێ دلۆزبیت لەکارەکەتدا تاژەنجامێکت هەبێتو خوا لێت رازی بێت • ئەو کارەی تۆ ئەیکەیت بریتی‌یە لەدروست کردنی کۆمەڵگایەکی یەگگرتوی بەهێز چونکە خێزان بناغەی هەموو کۆمەڵێکە ، بەچاك بوونی ئەو گشت شتێك چاك ئەبێت بەهەڵوەشانەوەی کۆمەڵ تێك‌ئەچێت . هەربۆ ئەم مەبەستەیشە ئایینی ئیسلام ئێجگار گرنگی داوە بەدروست بوونی خێزانی پاكو خاوێن،جاتۆیش ئاگات لەکارەکەت بێتو نەیەڵێت نەمامەکانت بێ‌ئاوببن تاووشك نەبن یاخود سەرماو گەرما بیان بات ئەوسا ڕەنجت بەبا بچێت ، لەم کارەتدا ئاگات لەوەبێت بەفەرمانو ویستی خوا دەست بدەرە هەموو ئیشەکانت لەم مەبەستەدا ـ

## - چاوه روان بن -

بەیارمەتی خوا بەمزوانە کتێبی « کوڕی شیرینم ئەمەیە بیرو باوەڕەکەت» ئەخرێتە بەردەستان بەشێوەی شانۆگەری ۰

هەڵەبجە/١٩٨١م

١٤٠١ ك

## خشتەی ڕاست وچەوتەکان

| چەوت | ڕاست | دێر | لاپەڕە |
| --- | --- | --- | --- |
| خاوەن | خاوەن باوەڕ | ١٤ | ٦ |
| زیانی | ژیانی | ٦ | ٧ |
| تاو | ناو | ٧ | ٨ |
| دەستپان | دەستیان | ٩ | ١٠ |
| گیروگرفتێکەان | کیروگرفتێکمان | ١ | ١١ |
| لەپروەردە | لەپەروەردە | ١٤ | ١١ |
| ەستاون | وەستاون | ١٠ | ١٣ |
| پێفەمبەر | پێغەمبەر | ٥ | ٢٢ |
| هاوزای | هاواری | ٦ | ٢٥ |
| یأبە | یابە | ٧ | ٢٨ |
| زایناری | زانیاری | ١٨ | ٢٨ |
| ئەڕوات | نەڕوات | ٧ | ٢٩ |
| کوبرانە | کوێرانە | ١ | ٣٠ |
| بنۆمیزو | بنێینو | | |

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١٣٩٠ لسنة ٩٨٢

# ئەم نامیلکەیە

دەری ئەخات کەمرۆڤی موسوڵمان چــــۆن خێزانەکەی پەروەرد، بکات بەپەروەردەیەکی ئیسلامی و دووری نجاتەوە لەهەموو ڕەشەبایەکـــی بێباوەڕی چەرخی بیستەم و چەرخەکانی لەمەو دوایشی · دوبارە دەستی پەروەردەکەر ئەگـــرێ بۆئەوەی کۆرپــــە شیرینەکانی نەکەونە سەر ئەو ڕێگا لارو چەوتانـەی کەئێستا باوون لەناو مرۆڤەکانـــداو زۆربـــەی موسوڵمانەکانی بێباوەر کردوە لەســـــەر بنیاتــی خۆرهەڵات وخۆرئاواو هەموو شتێکی تر ·

لەڕوویەکی ترەوە هانی باوکو دایکی موسوڵمان ئەدات بۆئەوەی کوڕانو کچانیان بەشێوەیـــەکــی ئیسلامییەك بخەن و خێزانیان لێ دروست بکەن ....

نرخي «٣٠٠» فلسه

---

مطبعة اسعد ـ بغداد